

# پوختەی ژیانی

# پێشەواو ئازیزمان ﷺ

نوسینی:

سالار عومەر



# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : پوختەی ژیانی پێشەواو ئازیزمان محمد(ﷺ)

نوسینی : سالارعومەر

وشەسازی : دایکی ڕێزدار

نەخشەسازی ناوەوە: ستافی پرۆژەی ئاگا

دیزاینی بەرگ : ڕێدارعومەر

نۆرە و ساڵی چاپ : ١٤٤٣ کۆچی،٢٠٢٢ زاینی،٢٧٢١ کوردی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە



بۆهەر ڕەخنە و پێشنارێك پەیوەندی بکەن بە نووسەر

 @salar_omer

 Salar Omer



**دەست پێك :**

## موژدەكان لە نزیكبوونەوەی ناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ:

موسڵمانان لەو بڕوایەدان كە خوا هەر پێغەمبەرێكی ناردبێت بەڵێنی لێوەرگرتووە كە بە نەتەوەكەی بڵێت باوەڕ بە دوایین پێغەمبەر بهێنن كە محەممەدە و سەری بخەن[1] ، وە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: **(دعوةُ أبي إبراهيمَ وبِشارةُ عيسى ورؤيا أمِّي )**[2]

واتە:- من بانگەوازی ئیبڕاهیمی باوكمم، مژدەكەی عیسام.

هەروەها لە كتێبەكانی سیرەدا هاتووە كەوا حاخامەكانی یەموود و قەشە مەسیحییەكانی ناو عەرەب باسیان لە هاتنی پێغەمبەر محەممەد كردووە پێش ناردنی كاتێك كاتەكەی نزیك بووەتەوە.[3]

فاڵگرەوە عەرەبەكان لەجنۆكە شەیتانەكانەوە زانیاریان كەبەدزیەوە گوێیان دەگرت و هەواڵەكانیان لەئاسمانەوە دەهێنا پێش ئەوەی ڕێگریان لێ بكرێت.

---

[1] لە تەفسیری ئیبن كەسیر، سورەتی ئەنعام

[2] الراوي : العرباض بن سارية | المحدث : شعيب الأرناؤوط | المصدر : تخريج صحيح ابن حبان /الصفحة أو الرقم | ٦٤٠٤ : خلاصة حكم المحدث : صحيح لغيره

[3] الصلابي, د علي" .صفات خير الأنام في التوراة والإنجيل" ) www.aljazeera.net .

"كيف أخبرت الكتب السماوية عن النبي (ص) وشريعته؟" .وكالة أنباء الحوزة



قەشە مەسیحییەکان و حاخامە جوولەکەکان لە کتێبەکانیان سیفەتی خۆی سیفەتی کاتی هاتنیان دەزانی[1]، و پێغەمبەرەکانیان بەڵێنیان لێوەرگرتبوون کاتێک هات باوەڕی پێبێنن.[2]

ئیبن عەبباس دەڵێت (**كانت يهود خيبر تقاتل غطفان فلمّا التقوا هُزمت يهود خيبر فعاذت اليهود بهذا الدعاء فقالت «اللهم إنا نسألك بحقّ محمد النبيّ الأميّ الذي وعدتنا أن تخرجه لنا في آخر الزمان إلا نصرتنا عليهم». فكانوا إذا التَقَوا، دعوا بهذا الدعاء فهزموا غطفان، فلما بُعث النبي ﷺ كفروا به فأنزل الله ﴿وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾**[3]

---

[1] بعض صفات النبي الموعود | موقع نصرة محمد رسول الله.."rasoulallah.net ،وە ( الصلابي, د علي" .صفات خير الأنام في التوراة والإنجيل" www.aljazeera.net .

[2] من أوصاف الرسول في التوراة والإنجيل -٢"-.. islamsyria.com ،وە (" صفات النبي (صلى الله عليه وآله) في التوراة - مركز الأبحاث العقائدية".. www.aqaed.com .

[3] بكر/السيوطي, جلال الدين عبد الرحمن بن أبي (٢٠١٥-٠١-٠١). (تفسير السيوطي (الدر المنثور في التفسير بالمأثور) Al Kotob Al Ilmiyah دار الكتب العلمية).

" ^ص٥ - شرح كتاب قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة - الكلام على حديث ابن عباس في معنى استفتاح اليهود على الذين كفروا - المكتبة الشاملة الحديثة".. al-maktaba.org .



واتە: جوولەکەکانی خەیبەر جەنگیان لەگەڵ غەتەفان دەکرد کاتێک بەیەک گەیشتن جوولەکەکانی خەیبەر دۆڕان، و جوولەکەکان ئەم دوعایەیان کرد: خوایە ئێمە داوات لێدەکەین بەحەقی پێغەمبەر محەممەدی ڕاستگۆ کە بەڵێنت داوە بۆمانی بنێری سەرمان بخەی بەسەریاندا، بۆیە کاتێک گەیشتن بەغەتەفان ئەو دوعایەیان کرد و لێیان بردنەوە، کاتێک پێغەمبەر وەحی بۆ هات باوەڕیان پێنەکرد، خوای گەورە ئایەتی دابەزاند (ئەوان لەپێشدا بە پێغەمبەر هەڕەشەیان لە بێباوەڕان دەکرد بەڵام کاتێک هات باوەڕیان پێنەهێنا).

لەباسی موسڵمان بوونی سەلمانی فارسی دەڵێت یەکێک لەڕاهیبەکان پێیگووتوە:
(قد أظلّ زمان نبي، مبعوث بدين إبراهيم يخرج بأرض العرب، مهاجره إلى الأرض بين حرّتين بينهما نخل، به علامات لا تخفى، يأكل الهديّة ولا يأكل الصّدقة، بين كتفيه خاتم النبوة، فإن استطعت أن تلحق بتلك البلاد فافعل)[1]

واتە: سەردەمی پێغەمبەرێک نیزیک بۆتەوە، بەدینی ئیبراهیم نێردراوە لەوڵاتی عەرەب دەردەکەوێت، کۆچ دەکات بۆ زەوییەک لەنێوان دوو چیا دایە و خورمای لێدەچێندرێت، چەند نیشانەیەکی هەیە: دیاری وەردەگرێت بەڵام خێر وەرناگرێت،

---

١. [1]الدمشقي, أبي الفداء إسماعيل بن عمر/ابن كثير (٢٠١٥-٠١-٠١).(البداية والنهاية ١-٨ مع الفهارس ج١: البداية والنهاية) ( دار الكتب العلمية)
٢. ^" إسلام ويب - هداية الحيارى في أجوبة اليهود والنصارى - القسم الأول في أجوبة المسائل - المسألة الثانية فيما لو اختاروا الكفر - قصة إسلام سلمان الفارسي - سلمان يلحق بقس عمورية- الجزء رقم١" islamweb.net.





لەنێوان شانەکانی مۆری پێغەمبەرایەتی هەیە، ئەگەر بتوانی بگەی بەو وڵاتە ئەوا پێی بگە.[1]

عامر کوڕی ڕبیعە دەڵێت: (سمعت زيد بن عمرو بن نفيل يقول أنا أنتظر نبيًا من ولد إسماعيل ثم من بني عبد المطلب بن هاشم ولا أراني أدركه، وأنا أؤمن به وأصدّقه وأشهد أنه نبيّ، فإن طالت بك مدة فرأيته فأقرئه مني السّلام، وسأخبرك ما نعته حتى لا يخفى عليك. قلت: هلمّ. قال: هو رجل ليس بالقصير ولا بالطويل ولا بكثير الشعر ولا بقليله وليست تفارق عينيه حمرة وخاتم النبوة بين كتفيه، واسمه أحمد، وهذا البلد مولده ومبعثه، ثم يخرجه قومه منها، ويكرهون ما جاء به حتى يهاجر إلى يثرب فيظهر أمره، فإيّاك أن تخدع عنه فإني طفت البلاد كلها أطلب دين إبراهيم، فكل من أسأل من اليهود والنصارى والمجوس يقولون "هذا الدين وراءك" وينعتونه مثل ما نعته لك ويقولون "لم يبق نبي غيره)[2]

واتە: گوێم لە عەمر کوڕی نوفەیل بوو دەیگووت چاوەڕێی پێغەمبەرێک دەکەم لەنەوەی ئیسماعیل، دواتر لەنەوەی عەبدول موتەڵیب کوڕی هاشم و وانازانم پێیبگەم، من باوەڕم پێی هێناوە و بەڕاستی دادەنێم و شایەتی دەدەم پێغەمبەرە، ئەگەر تەمەنت درێژ بوو و پێی گەیشتی لەمنەوە سەلامی لێبکە، و سیفاتەکانیت پێدەڵێم تاوەکوو لێت تێکنەچێ. گووتم: پێم بڵێ. گووتی: پیاوێکە نەزۆر درێژە نەزۆر

[1] عويص, د إيهاب .كهولة قبل البلوغ

[2] السيرة النبوية - ابن كثير - ج ١ - الصفحة ١٥٩/ لە صەحیحی بوخاری هاتووە.



کورتە، پرچی نەزۆر درێژە نەزۆر کورتە، سورایی هەمیشە لەچاوەکانیدا هەیە و مۆری پێغەمبەرایەتی لەنێوان شانەکانیەتی، ناوی ئەحمەدە و ئەو وڵاتەی ئێرە شوێنی لەدایکبوون و ناردنیەتی، دواتر گەلەکەی لە وڵات دەریدەکەن و ڕقیان لە بەرنامەکەیەتی، ئینجا کۆچدەکات بۆ مەدینە و سەردەکەوێت، ئاگات لێبێت لێت تێکنەچێت من هەموو وڵاتان گەڕاوم بەدوای دینی ئیبراهیم، پرسیارم لەهەر جوولەکە و مەسیحی و ئاگرپەرستێک کردبێت گووتویانە: بگەڕێوە لەوەڵاتی تۆ سەرهەڵدەدا، بەو شێوەیەی بۆم وەسف کردی ئاوا بۆیان وەسف کردووم و دەیانگووت تەنیا ئەو پێغەمبەرە ماوە بنێردرێت.

محەممەد پێش پێغەمبەرایەتی چەند شتێکی دەبینی لەوانە **(إني لأعرف حجرًا بمكة كان يسلّم علي قبل أن أُبعث، إني لأعرفه الآن)**

واتە: من بەردێک دەزانم لەمەککە پێش پێغەمبەرایەتی سەلامی لێدەکردم، ئێستا دەیناسمەوە.

ئەگەر ویستبای دەست بەئاو بگەیەنێت دوور دەکەوتەوە تا ماڵەکانی مەککە وندەبوون و دەچوو بۆ شیو و دۆڵەکانی دەوری مەککە، بەلای هەر دار یان بەردێکدا تێپەڕیبا دەیگووت «سەلامت لێبێت ئەی پێغەمبەری خوا»[1]، سەیری لای

[1] حجرُ يسلم على رسول الله - شبكة الشفاء العالمية". حجرُ يسلم على رسول الله .وە (" سلام الحجر على النبي - موقع مقالات إسلام ويب)





ڕاست و چەپی خۆیدەکرد تەنیا بەرد و داری دەبینی، ئەو بارودۆخە بەردەوام بوو تاوەکوو جبرەئیل هات بۆلای لە ئەشکەوتی حیرا.[1]

## خودای گەورە پێغەمبەر دەپارێزێت پێش بوون بە پێغەمبەر:

ئیبنو ئیسحاق ( ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت : ( پێغەمبەری ئازیز گەورەبوو،خوای گەورە پاراستی لەهەموو کارێکی نابەجێ نەفامی،چونکە دەیویست ئەو هەموو ڕێز و سەرورەرییەی پێ ببەخشێت و بیخاتە ڕیزی پێغەمبەرانەوە.

پێغەمبەری خوا لەناو خزمەکانیدا لەهەموویان خوڕەوشت جوانتربوو.لەهەموویان چاکەی زۆرتر بوو.لەهەموویان بەشەرەف تر بوو.لەدراوسێیەتیدا لەهەموویان چاکتربوو.لەهەموویان لەسەرخۆتر بوو.لەهەموویان ڕاستگۆتر و دەستپاکتربوو.دوورترین کەس بوو لەو خراپانەی کە مرۆڤی پێ لەکەدار بکرێت،خزمی خۆی بەدانپێدانانی خۆیان نازناوی الصادق الامین واتە : ڕاستگۆ و متمانە پێکراویان لێ نابوو،چونکە خاوەنی ئەم هەموو ڕەوشتە جوانانەبوو.[2]

---

[1] البداية والنهاية، ابن كثير، بەرگی ٣، لاپەڕە ٥-٣٣

[2] بڕوانە : السيرة ابن هشام (٢٩١/١)



پێغەمبەری خودا هەرگیز بتی نەپەرستووە،بەبەڵگەی : **(عن هشام بن عروة، عن أبيه، قال: حدثني جار، لخديجة بنت خويلد أنه سمع النبي صلى الله عليه وسلم وهو يقول لخديجة " :أي خديجة، والله لا أعبد اللات ، والله لا أعبد العزى أبدا)**[1]

واتە:- عوروەی کوڕی زوبێر ( ڕەزای خوای لێبێت)دەفەرموێت : دراوسێیەکی خەدیجەی کچی خوەیلەد ( ڕەزای خوای لێبێت) بۆی گێڕامەوە و گوتی : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا بەخەدیجەی دەفەرموو پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر : **(أي خديجة، والله لا أعبد اللات ، والله لا أعبد العزى أبدا)** ئەی خەدیجە واللە ی من هەرگیز "لات" ناپەرستم و هەرگیزیش " عوزا" ناپەرستم،خەدیجەش لەوەڵامدا دەیگوت : باشە واز لەلات و لە عوزاش بێنە.(لات و عوززا دوو بت بوون لەسەردەمی جاهیلیدا دەپەرستران).

هەروەها پێغەمبەری خوا هەرگیز تاوانی نەکردووە گەر هەوڵی ئەنجامدانی کارێکیشی دابێت کە جوان و گونجاو نەبووبێت بۆ پێغەمبەرایەتی ئەوە خودای گەورە پاراستوویەتی،بەبەڵگەی وتەی پێغەمبەری خودا کە فەرموویەتی :. ( **مَا هَمَمْتُ بِقَبِيحٍ مِمَّا يَهُمُّ بِهِ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ إلا مَرَّتَيْنِ ، عَصَمَنِي اللَّهُ فِيهِمَا ، قُلْتُ لَيْلَةً لِفَتًى مِنْ قُرَيْشٍ : أَبْصِرْلِي غَنَمِي حَتَّى أَسْمُرَهَذِهِ اللَّيْلَةَ بِمَكَّةَ كَمَا تَسْمُرُ الْفِتْيَانُ ، قَالَ : نَعَمْ ، فَخَرَجْتُ حَتَّى جِئْتُ أَدْنَى دَارٍ مِنْ دُورِ مَكَّةَ ، فَسَمِعْتُ غِنَاءً وَصَوْتَ دُفُوفٍ وَمَزَامِيرَ ، فَقُلْتُ : مَا هَذَا ؟ قَالُوا : فُلَانٌ تَزَوَّجَ ، فَلَهَوْتُ بِذَلِكَ حَتَّى غَلَبَتْنِي**

---

[1] اخرجه : الامام احمد ( المسند) (٢٢٢/٤)





**عَيْنِي ، فَنِمْتُ ، فَمَا أَيْقَظَنِي إِلَّا مَسُّ الشَّمْسِ ، فَرَجَعْتُ إِلَى صَاحِبِي ، ثُمَّ فَعَلْتُ لَيْلَةً أُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ ، فَوَاللَّهِ مَا هَمَمْتُ بَعْدَهَا بِسُوءٍ مِمَّا يَعْمَلُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ ، حَتَّى أَكْرَمَنِي اللَّهُ بِنُبُوَّتِهِ)[1]**

واتە:- نیازی ئەنجامدانی شتێکی ناشرینم نەکردووە لەوەی کەسانی زەمانی جاهیلی کردوویانە تەنها دووجار نەبێت،هەردوو جارەکەش خوای گەورە منی پاراست،شەوێکیان گەنجێك لەقورەیش لەگەڵمدابوو لەناو مەڕەکاندا[2] ،هەردووکمان دەمانلەوەڕاندن، پێم گوت : ئاگات لەمەڕەکانم بێت تا ئەمشەو دەچمەوە مەککە و شەوچەرە دەکەم وەک گەنجەکانی مەککە ،گوتی : بەڵێ باش،منیش چووم تا گەیشتمە یەکەم خانوو لەخانووەکانی مەککە،گوێم لەدەنگی دەف و گۆرانی و جوزەلەبوو،گوتم ئەوەچییە ؟ ،گوتیان : ئەوە فلان ژنە شووی کردووە بە فلان پیاو،باسی پیاوێکی قورەیشییان دەکرد کەژنێکی قورەیشی گواستۆتەوە،منیش وەستام لەوێ تا گوێ بگرم لەئاهەنگەکە،دەستبەجێ چاوم چووە خەو و خەوم لێ کەوت،تا گەرمایی تیشکی خۆری بەیانی بەئاگای هێنامەوە،پاشان هاتمەوە بۆلای هاوەڵەکەم و پێی گوتم : چیت کرد؟ منیش هەواڵەکەم بۆی گێڕایەوە،پاشان شەوی دووەمیش بەهەمان شێوە دووبارەم کردەوە و بەهەمان شێوە هاتم گوێ بگرم بەڵام بەهەمان شێوە چاوم چووە خەو تا تیشکی خۆر بەئاگای هێنامەوە و گەڕامەوە بۆلای هاوەڵەکەم و هەمان شێوە پرسیاری لێکردم و گوتی چیت کرد؟ منیش لەوەڵامدا گوتم : هیچم نەکرد،

---

[1] اخرجة : ابو نعيم في الدلائل (١٢٨)،والحاكم (٢٤٥/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

[2] ئەوکات پێغەمبەری خودا شوان بوو.





پێغەمبەری خوا دەفەرموێت : وەڵاهی دوای ئەو دوو جارە نیازی هیچ کارێکی ناشرینم نەبووە لەو کارانەی خەڵکانی سەردەمی نەفامی ئەنجامیان دەدا،تا خوای پەروەردگار ڕێزی لێگرتم بە پێغەمبەرایەتی.

پێش بوونی بە پێغەمبەر بەڵگەی تریش هەن وەک نەخواردنی گۆشتی سەربڕاو بۆ بتەکان و بەپیرۆز دانانی بت و دەست پێداهێنانیان و چەندینی تر ...کە خوای گەورە پێغەمبەری لێ پاراستووە.

## سەرەتای بۆ نیشاندانی پێغەمبەرایەتی :

خوای گەورە پێش ئەوەی پێغەمبەرایەتی ببەخشێت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە شاری مەککە دا بەردێکی هێنا بووە زمان و سڵاوی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکرد پێش بوونی بە پێغەمبەر :- ( جابری کوڕی سەمرە ) (ڕە زای خوای لێبێت) دەفەرموێت : پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: -**إنَّ بمَكَّةَ حجَرًا كانَ يسلِّمُ عليَّ ليالِيَ بُعثتُ، إنِّي لأعرِفُهُ الآنَ.**[1]

واتە :من بەردێك دەزانم کە لە مەککەدا سەلامی لێ دەکردم پێش ئەوەی ببم بە پێغەمبەر و ئێستاش دەیناسمەوە.

---

[1] الراوي : جابر بن سمرة | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الترمذي | الصفحة أو الرقم | ٣٦٢٤ : خلاصة حكم المحدث : صحيح





پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕووناكی دەهاتە بەرچاوی ئەویش ڕوناكی مەلائیكە بوو ، وە گوێشی لە دەنگ بووە( دیارە دەنگی مەلائیكە بووە) ( والله أعلم) وە ترساوە لەوەی كە تێك چوو بێت !! وەك (ابن عباس) (ڕە زای خوای لێبێت) دەفەرموێت: ( پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە خەدیجەی فەرموو : **إني أسمعُ صوتًا وأرى ضوءًا وإني أخشى أنْ يكونَ بي جنُنٌ .[١] أو قال: جنونٌ قالتْ خديجةُ: لم يكُنِ اللهُ لِيَفعَلَ ذلك بكَ يا ابنَ عبدِ اللهِ ثم أتَتْ خديجة ورقة فذكرت ذلك له فقال ورقة :إن كان صاحبك صادقا فإن هذا ناموس مثل ناموس موسى وإن يبعث وأنا حي فسأعزره وأومن به وأنصره.[٢]**

واتە : من دەنگێك دەبیستم و ڕوناكیەك دەبینم دەترسم كە تێك چووبم ، خەدیجەش دەیفەرموو: نەخێر خوای گەورە هەرگیز وات پێ ناكات ، وەرە با بچین بۆلای ( وەرەقەی كوڕی نوفەل ) پاشان چوون بۆلای وەرەقە و ، بۆیان گێڕایەوە ، وەرەقەش ووتی : گەر ئەوە ڕاست بێت ئەو فریشتەیەی هاتووە بۆلای تۆ هەر ئەو فریشتەیەیە كە هاتوە بۆلای موسا (علیه السلام) و ئەگەر تۆ ببیت بە پێغەمبەر و من زیندوببم باوەڕت پێ دەهێنم و سەرت دەخەم ) .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)سەرەتای پێغەمبەرێتی بە خەوی ڕاست دەستی پێكرد كە وەك بەرەبەیان دەهاتە دی ، لە ( عائیشە ) وە (رضي الله عنها)

---

[٢] الراوي : عبدالله بن عباس | المحدث : البوصيري | المصدر : إتحاف الخيرة المهرة /الصفحة أو الرقم | ٧/٢٤٦ : خلاصة حكم المحدث : إسناده صحيح





دەفەرموێت:( پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر خەوێکی ببینیایە وەك ڕووناکی ڕۆژ لە بەرەبەیاندا دەهاتە دی )

وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر حەزی بەگۆشەگیری دەکرد و هەموو جارێ دەچووە ئەشکەوتی ( حراء ) و تیایدا دەمایەوە بۆ عیبادەت کردن و بیرکردنەوە لە ئاسمان و زەوی و کاروباری خەڵکان و گەڕانەوەیان بۆلای خوا .

## ئەشکەوتی حیراء

ئەشکەوتی حیراء لەسەر شاخێکە،ناسراوە بە کێوی نوور[1]، بەرزیەکەی ٦٣٤ مەترە، «شاخی نوور لە دووری دوو میل لە مەککەوە»[2]چوار کیلۆمەتر لە حەرەمەوە دوورە، هەموو جارێ پێغەمبەر (ﷺ) چوار کیلۆمەتر ڕێی بڕیوە بۆ ئەو شوێنە.

ئەشکەوتەکە دەڕوانێت بەسەر کەعبەدا، واتە لەوێوە کەعبەت لەبەرچاوە، شاخێك هەمووی بەردەڵانە و تەنها ئەو ئەشکەوتەی تێدایە، تەواو کەشێکی لەباری هەیە بۆ پەرستش، کەسێك چووبێتە ئەوێ هەست ئەکات بەوەی لە دنیا دادەبڕێت و کەشێکی تایبەتی بۆ دروست دەبێت، بەتایبەت ئەگەر شوێنەکە چۆڵ بێت، هەروەها شوێنەکەش بچووك بووە، ئەو گومانە هەڵناگرێت بڵێن شوێنەکە

[1] چونکە نووری ئیسلام لەوێوە درەوشایەوە

[2] الرحيق المختوم، المباركفوري، دار المؤيد، ص٦٥.





گەورە بووەو لەوێ موحەممەد مامۆستای هەبووەو وانەی لەلا خوێندووە، شوێنەکەش ماوەتەوەو پارێزراوە و کەس ناتوانێت گومانی لەسەر دروست بکات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ماوەی لە ئەشکەوتدا بوو، سەرقاڵی پەرستش بوو، بەڵام دەقێکی صەحیحمان پێ نەگەیشتووە کە جۆری پەرستشەکەی چۆن بووە، هێندە دەزانین پێغەمبەر (ﷺ) پێش پێغەمبەرایەتی شارەزای هیچ ئایینێك نەبووە،بۆیە دەتوانین وا تێبگەین پێغەمبەر (ﷺ) زیاتری پەرستشەکەی بریتی بووە لە بیرکردنەوە لە کەون و بوونی خوا و تاك و تەنهایی پەروەردگار.

## دابەزینی سروش ( وەحی ):

کاتێک گەیشتە تەمەنی چل ساڵی بە زۆری دەردەچوو بۆ ئەشکەوتی حیرا[1] دەمایەوە کە ئەمەش لە هەموو ساڵێکدا بوو[2]، ئاو و خواردنی لەگەڵ خۆی دەبرد و مانگێک تیایدا دەمایەوە و پەرستن و تێڕامانی دەکرد[3]. موسڵمانان لەو بڕوایەدان کە بۆ یەکەم جار سروشی بۆ دابەزی لە ١٧ی[4] ڕەمەزان[1] یان ٢٤ی ڕەمەزان[2] یان ٢١ی

[1] السيرة النبوية سير وعبر، مصطفى السباعي، ص١٣-٢٩،

[2] البداية والنهاية ،ئیبن کەسیر، ج٣، لا٥-٣٣

[3] عيون الأثر في فنون المغازي والشمائل والسير، ابن سيد الناس، ج١، ص١٠٩-١٢٠، مؤسسة عز الدين، بيروت، ط١٩٨٦

[4] لەکتێبی ( ژیانی ئازیزمان : نوسینی : حبیب محمد سعید/ ل،١٧١)هاتووە دەڵێ بەپێی سورەتی الانفال ئایەتی (٤١) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە (١٧)ڕەمەزان وەحی دابەزیوە،کە دەکاتە ڕۆژی شەشی ئابی ساڵی (٦١٠) زاینی.



ڕەمەزان[3] بەرامبەر ١٠ی ئابی ٦١٠ز،ئەگەر ئەو بەرواره ئەژماربکەین ئەو کاتە تەمەنی پێغەمبەری خودا چل ساڵی قەمەری و شەش مانگ و دوازده ڕۆژبووە،کە دەکاتە ٣٩ ساڵ و دوو مانگ و بیست ڕۆژ بەساڵی زاینی.[4]

عائیشە بەسەرهاتی دابەزینی سروش دەگێڕێتەوە و دەڵێت:پێغەمبەر سەرەتا خەونی ڕاستی دەبینی، هەر خەونێکی دیتبا وەک بەری بەیان دەهاتە دی، دواتر خەڵوەتی لەلا خۆشەویستکرا و خەڵوەتی دەکرد لە ئەشکەوتی حیڕا، و چەند شەوێک تێیدا دەماوە بەندایەتی دەکرد پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆلای خێزانەکەی، بۆئەوەی کەلوپەلی پێویست لەگەڵ خۆی ببات،لەسەر ئەوکارە بەردەوامبوو تاوەکوو وەحی بۆهات لەئەشکەوتی حیڕادا، جوبرەئیل هات بۆلای و پێیگووت: بخوێنە، ئەویش گووتی: خوێندەواریم نییە، پێغەمبەر گووتی: بە توندی باوەشی پێداکردم تاوەکوو ئازاریدام دواتر بەریدام و گووتی: بخوێنە، گووتم: خوێندەواریم نییە، پێغەمبەر گووتی: جاری سێیەم بە توندی باوەشی پێداکردم تاوەکوو ئازاریدام

---

[1] الطبقات الكبرى، ابن سعد البغدادي، ج١، ص١٩٠-١٩٨، دار صادر، بيروت.

[2] البداية والنهاية ،ئیبن کەسیر، ج٣، لا٥-٣٣

في مسند أحمد، ج٤، ص١٠٧، والجامع الصغير، للسيوطي، رقم:٢٧٣٤، وحسّنه: «أن رسول الله قال: "أُنزل القرآن لأربع وعشرين خلت من رمضان«"

[3] الرحيق المختوم، المباركفوري، دار المؤيد، ص٦٥.

[4] الرحيق المختوم





دواتر بەریدام و گووتی: ( اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١)خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢)اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤)عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥))[1]

واتە:- بخوێنە بەناوی ئەو خوایەی دروستی کردووی، مرۆڤی لە خوێنپارەیەک دروستکردووە، بخوێنە خوای تۆ بەخشندەترینە، ئەو خوایەی بەهۆی پێنووس مرۆڤی فێرکردووە، فێری ئەو شتانەی کردووە کە نەیزانیوە .

ئەمە یەکەم ئایەت و سورەتی قورئان بوو دابەزی بۆ پێغەمبەری خودا و یەکەم گزنگی بەختەوەری لە ئاسمانەوە بەرەو زەوی هات.

ئەو زەویەی پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر (ﷺ)، مرۆڤایەتی بەدەست گومڕایی و سەرلێشێواوی و نەفامی و شرک و بێباوەڕییەوە دەینالاند بەگشتی و عەرەبەکانیش بەشێك بوون لەو مرۆڤایەتییە نوقم بووە لەو دەریای ڕووخان و دارمانەدا، کە پێویستی بە یەکێك بوو دەریهێنێت و ڕزگاری بکات لەو حاڵەی کە تێیدایە.

نەفامی و نەخوێندەواری بەربڵاو بوو،ستەم ڕیشەی داکوتی بوو،بێسەرەوبەری و پەرتەوازەیی هەموو شوێنێکی گرتبۆوە، مافەکان زەوت کرابوون، ژیانێك بێ هیچ دەستوور و یاسایەك، بێ هیچ بەرنامە و شەریعەتێك پیادە دەکرا، جگە لە هەندێ خوونەریت و عورفی تیرەگەری نەبێت .

هێمنی و ئاسایش نەمابوو کۆچەری و کاروانەکانی بازرگانی لەلەرز و مەترسیدابوون، هەڵکوتانەسەر و دەستدرێژی بەهێزەکان بۆ سەر لاوازەکان

---
[1] العلق





کارێکی ئاسایی بوو،شەڕ و پێکادان لەبەر بێنرخترین هۆکار ڕووی دەدا و گیانەکان دەکێشران بەبێ هۆ ، ژن بێ پیاو دەبوو، منداڵ بێ باوك دەکەوت .

لە سێبەری ئەم بارودۆخ و وێنە تاریکەدا و پاش ماوەیەکی زۆر لە پچڕانی پێغەمبەرایەتی، خوای باڵادەست لە تەمەنی چل ساڵیدا پێغەمبەری (ﷺ) بۆ مرۆڤایەتی نارد.

## وەحی ناردن بۆلەتەمەنی چل ساڵی ؟ :

کاتێک مرۆڤ دەگاتە تەمەنی چل ساڵی ، هەست بە گۆڕانکاری ڕیشەیی دەکات لەخۆیدا،گۆڕانکاری لە زۆر کایەی ژیانی و بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیدا ڕوودەدات.

تەمەنی مرۆڤ وا دابەشکراوە کە سەرەتا لە پێش یەك ساڵیدا بە کۆرپە ناسراوە، دواتر ئینجا منداڵ، پاشان هەرزەکار، پاش تەمەنی پانزە ساڵی بۆ ٢٥ ساڵی گەنجە، لە ٢٥ تا ٤٠ ساڵی گەنجێکی کامڵە، ئیتر لە چل ساڵیەوە بە مرۆڤێکی کامڵ ناودەبرێ، واتە ماوەی ناوەڕاست کە ماوەی چل ساڵیە چاکترین ماوەیە

هەرچەندە پێشتر وا دیاری کرابوو کە تەمەنی ٢١ ساڵی باشترین تەمەنە، بەڵام دواتر لێکۆڵینەوە زانستیەکان بەرەو پێشتر چوونو دواجار گەیشتنە ئەو بڕوایەی تەمەنی چل ساڵی باشترین تەمەنە، بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە مێشکی مرۆڤ





لە چل ساڵیدا پڕ ئەبێتەوە، واتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کامڵبوونی مێشکیدا بووە ئینجا کراوە بە پێغەمبەر.

تەمەنی چل ساڵی تەمەنێکە ئیتر حەزی جنسی مرۆڤ بەرەو لاوازبوون هەنگاو دەنێ، ئەمەش بۆیە وا دانراوە هەتا مرۆڤ پێش ئەو تەمەنە هەوڵی هاوسەرگیری بدات و منداڵی هەبێت، هێندە لەگەڵ منداڵەکەیدا بژی کە بە چاوی خۆی گەورەبوونو پێگەیشتنی منداڵەکەی ببینێت، ئافرەت لە دوای چل ساڵیەوە زۆر بە کەمی سك دەکات، بۆیە پێویستە زوو هاوسەرگیری بکات هەتا منداڵی ببێت.

تەمەنی چل ساڵی بەدوا تەمەنی ناوەندی پێ دەوترێت، بەرزترین ئاستی تێگەیشتنی مرۆڤە، مرۆڤ تیایدا زاڵدەبێت بەسەر عاتیفەکانیدا و سیفەتی هەرزەیی تێدا نامێنێت، چاکتر ئەتوانێت بەرنامەو پلان دابنێت و ئەزموونی چل ساڵ پێشتری لەبەردەستدایە، عەقڵی سەروو چل ساڵ ئەتوانێ وزەی گەنجان رێك بخات و ئاراستەی بکات.

کەواتە دەتوانین بڵێین پێغەمبەر (ﷺ) لە چڵەپۆپەی پێگەیشتن و لە تەمەنی چل ساڵی و لە ناو ئەشکەوتێ لە لووتکەی کێوی نوور لەلایەن جبریلەوە بەرزترین و کامڵترین پەیامی بۆ نێردراوە هەتا ببێتە کۆتا پەیامی خوا بۆ کۆتا پێغەمبەری خوا هەتا ڕۆژی دوایی، پەیامەکەش بۆ هەموو مرۆڤایەتی بێت و نە سنووری جوگرافی و نە کات و سەردەم سنوورداری نەکردووە.[1]

---

[1] د.عبدالواحید



## گەڕانەوەی بۆ لای خەدیجە :

پێغەمبەر ﷺ بەترسێکی زۆرەوە گەڕایەوە ماڵەوەو بەخەدیجەی گووت **: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي**، دامبپۆشن دامبپۆشن، دایانپۆشی تاوەکو ترسەکەی نەما.

دوای ئەوە بەخەدیجەی گووت چ ڕوویداوە و پێی گووت لەژیانی خۆم ترسام شتێکم بەسەربێت، خەدیجە گووتی: **(كلا والله ما يخزيك الله أبدا، إنك لتصل الرحم، وتحمل الكل، وتكسب المعدوم، وتقري الضيف، وتعين على نوائب الحق)**[1]

واتە:- نا سوێند بەخوا، هەرگیز خوای گەورە سەرشۆڕت ناکات و پشتت بەرنادات، تۆ پەیوەندی خزمایەتی بەجێدەگەیەنیت و پاڵپشتی بێدەرەتانانی و دەستگرۆی نەبوانیت، میواندارى میوانان دەکەیت و لەسەر حەق هاوکار و پشتیوانیت.[2]

---

[1] (متفق عليه)

1. " [2] ص١٩٣ - كتاب التعريف بالإسلام - بدأ الوحي - المكتبة الشاملة الحديثة"..al-maktaba.org .
2. ^" حديث عن بدء الوحي من صحيح البخاري (٧ أحاديث)"-www.al . hamdoulillah.com.
3. ^" د. علي محمّد الصلابيّ - الحلقة التاسعة (٩): نزول الوحي على سيِّد الخلق محمد ﷺ ".رسالة بوست)





## چوونە لای وەرەقەی کوڕی نەوفل :

خەدیجە لەگەڵ خۆی بردی بۆلای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە ئامۆزای خەدیجە بوو، لەنەفامیدا ببوو بە مەسیحی، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەربێت ئینجیلی بەعیبری دەنووسی، پیاوێکی پیربوو بینایی لەدەستدابوو. خەدیجە گووتی: ئەی ئامۆزاکەم گوێ لەبرازاکەت بگرە بزانە دەڵێ چی، وەرەقە گووتی کوڕە برا دەڵێی چی؟ پێغەمبەر ئەوەی دیتبووی بۆی گێڕایەوە، وەرەقە پێیگووت: ئەوە هەر ئەو شتەیە کەبۆ مووسا دابەزیوە، خۆزگە گەنج و بەتوانا دەبووم کاتێک گەلەکەت دەرتدەکەن، پێغەمبەر گووتی: ئەوان دەرمدەکەن؟ وەرەقە گووتی: بەڵێ، هەر کەسێک شتێکی وەک ئەوەی تۆی هێنابێت دوژمنایەتی کراوە، خۆ ئەگەر لەوکاتەدا زیندووبم زۆر چاک سەرتدەخەم بەڵام وەرەقە ماوەیەکی پێ چوو وەفاتی کرد.

---

٤. ^[٨] "كتاب بدء الوحي (٠٢٨) | الموقع الرسمي لمعالي الشيخ عبد الكريم بن عبد الله الخضير - حفظه الله تعالى



## پچڕانی وەحی :

لە دوای ئەو ڕووداوە ماوەیەک سروشی بۆ نەهات[1]،گوتراوە چل ڕۆژ یان کەمتر[2]، گوتراوە شەش مانگ[3]، گوتراوە نزیکەی سێ ساڵ یان کەمتر بووە[4].

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی فەرموویەتی : مەبەست ئەوەیە کە ماوەیەکی دیاریکراو وەحی دواکەوت ،ئەوەش بۆ ئەوەبوو ئەو کاریگەرییەی پێغەمبەری خوا لەبینینی جبریل لەسەری بوو نەمێنێت،هەروەها بۆ ئەوەی پەرۆشی پەیدابکات بۆ گەڕانەوەی.

جابر ( ڕەزای خوای لێبێت)دەڵێت،پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : **(بَيْنا أنا أمْشِي إذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّماءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي، فإذا المَلَكُ الذي جاءَنِي بحِراءٍ جالِسٌ علَى كُرْسِيٍّ بيْنَ السَّماءِ والأرْضِ، فَرُعِبْتُ منه، فَرَجَعْتُ فَقُلتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي**

---

" [1] فصل: مطلب أول سورة نزلت وفترة الوحي وسببها:إنداء الإيمان" www.al-eman.net. /" انقطاع الوحي" .صحيفة الخليج )

" [2] فترة الوحي (انقطاعه) من كتاب خاتم النبيّين ﷺ - كتب سيرة الرسول" .فترة الوحي (انقطاعه) من كتاب خاتم النبيّين ﷺ - كتب سيرة الرسول)

" [3] انقطاع الوحي عن النبي ﷺ" .مداد (بە عەرەبی).

" [4] السيرة النبوية (٩)..عودة الوحي بعد إنقطاعه والدروس المستفادة - وضوح الاخبارى"





**فأنْزَلَ اللَّهُ تَعالَى: {يا أيُّها المُدَّثِّرُ. قُمْ فأنْذِرْ}[1] إلى قَوْلِهِ {والرُّجْزَ فاهْجُرْ}[2]. فَحَمِيَ الوَحْيُ وتَتابَعَ.[3]**

واتە:- لەکاتێکدا ڕێمدەکرد دەنگێکم بیست لەنێوان ئاسمان و زەویدا،منیش زۆر ترسام و گەڕامەوە ماڵ گوتم : داماپۆشن،ئیتر خوای گەورە سورەتی المدثر ی دابەزاند و دوای ئەوە وەحی نەوەستاوە.

سەبارەت بەماوەی وەستانی وەحی،(صفی الرحمن المبارك الفوري ) دەڵێت :زانایان ڕای جیاوازیان هەیە،وە بۆچوونی پەسەند ئەوەیە پچڕانی وەحی چەند ڕۆژێک بووە،ڕیوایەتیش لە ئیبن و عەبباسەوە هاتووە کە ئەو واتایە دەگەیەنێت.

بەڵام ئەو بۆچوونەی دەڵێت دووساڵ یان زیاتر بووە ئەوەیان ڕاست نییە،دەربارەی ئەو هەواڵانەش کەباسی خەم و خەفەتی پێغەمبەر ﷺ دەکات گوایە ویستوویەتی لەچیا بەرزەکانەوە خۆی بخاتە خوارەوە بەڵام جار جار جبريل خۆی نیشانداوە تا ئەو کارەنەکات،ئەو هەواڵانە لاوازن و ناگونجێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا.[4]

بەڕاستی وەحی بەتەواوی لە پێغەمبەر ﷺ نەپچڕا لەو ماوەیە کە ئاماژەی بۆ دەکرێ،بەڵکو تەنها وەستاوە وەك ئەوەی تەعبیری لێ دەدرێتەوە لە فەرمووده

---

[1] [المدثر:٢]

[2] [المدثر:٥]

[3] الراوي : جابر بن عبدالله | المحدث : البخاري | المصدر : صحيح البخاري | الصفحة أو الرقم | ٤ : خلاصة حكم المحدث ] :صحيح | [التخريج: أخرجه البخاري (٤)، ومسلم (١٦١) باختلاف يسير.

[4] سیرەی صەلابی (ل. ١٣١) وەرگێڕانی احسان برهان الدين .





صەحیحەکاندا وەك لە صەحیحەین و ئەوانی دیکەشدا هاتووە، وە بەردەوام فریشتەی نیگا دەهاتە سەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڵام قورئانی بۆ نەدەهێنا، لە بەر ئەوە لە فەرموودەکاندا بەم شێوەیە هاتووە: " ثم فتر الوحی" "لە پاشاندا وەحی وەستا" واتە هاتنە خوارەوەی قورئان لەو ماوەیەدا دوا کەوت، وە لە کۆتایی فەرموودەکەی بوخاریدا: فحمی الوحی وتتابع.. ئەوجا وەحی گەرم بوو بە دوای یەکدا هات.. حافظی ئیبن حجر لە (الفتح)دا دەڵێت: أی جاو کثیرا، وفیه مطابقه لتعبیره عن تأخره بالفتور، إذ لم ینته إلی انقطاع کلی.. فیوصف بالچد وهو البرد.

واتە: بە زۆری هات، ئەمەش موتابیقی لێکدانەوەکەیەتی بەوە کە پچڕانەکە دواکەوتنی وەحی بووە، ئەوەتە بە پچڕانی تەواو کۆتایی نەهات.

وە لەوانەشە حیکمەت و دانایی لە پچڕانی وەحی و نەهاتنە خوارەوەی قورئان لەوماوەیەدا شەوق و گەشەیەك بوبێ بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تاکو زیاتر هەست و گوڕو تینی هەبێ بۆ وەرگرتنی قورئانی پیرۆز پاش ئەوەی کە چێژی لێ بینی لە یەکەم جارداو شیرینی چووە دڵیەوەو دڵنیا بوو کە فەرموودەی خوایە، تاکو لە داهاتودا بتوانێ ئەو بارە گرانە بخاتە سەرشانی و لە پێناوی گەیاندنیدا بەرگەی ئەشکەنجەو ئازار بکات[1] .

---

[1] پێگەی (الشبکە الاسلامیه)





## وەحی چییە و جۆرەکانی وەحی :

وەحی چییە ؟

وەحی : بریتییە لەوەی کە خوای گەورە لەڕێی پێغەمبەرانەوە ئاگاداری میللەتەکان دەکاتەوە، لەمەبەستی دروستکردنی مرۆڤ و چۆنیەتی ژیان کردن و ئەنجامدانی عیبادەتەکان،جا لەڕێگەی کتێبەوە بێ یان بە گووتن بێ ،وە ئەم پەیام ناردنەش بۆ پێغەمبەران لەڕێگەی فریشتەوە بێ یان ڕاستەوخۆ خوای گەورە خۆی بە پێغەمبەرەکەی گەیاندبێ.

### زانایان پێناسەی وەحی یان بەدوو شێوە کردووە :

١-بەپێی ئەو کەسەی وەحی بۆ دێت : ئەو کەسەی وەحی بۆ دێت هەست دەکات بەو بەرەکەتە و بەیەقینیش لەلای ڕوونە کە ئەمە لەلایەن خواوەیە.

٢-بەپێی سەرچاوەی هاتنی : ئەمەش مەبەست لەوەیە پەروەردگار ناردوێتی بۆ پێغەمبەرانی،ئەو وەحییەش بریتییە لەو هەواڵ و غەیبی و لەو حوکمە شەرعییانەی کە بەهۆی ئەم وەحییەوە ئاگاداری کردوون.



**بۆ ئیمکانبوونی وەحی دوو کارپێویستن :**

١-سەرچاوەی ناردنی وەحی،ئەویش خوای گەورەیە،بوونی مەلائیکەتێکی دەستپاک تا ئەو وەحییە لەلایەن خواوە بە پێغەمبەران بگەیەنێ.

٢-بوونی دەروونێکی مرۆڤانەی پاک و بێگەرد،کە خاوەنی توانایەکی تایبەتی بێ بۆ وەرگرتنی وەحی لەخواوە بەڕاستەوخۆ،یان لەو مەلائیکەتەوە کە خوا ڕەوانەی دەکات.[١]

**جۆرەکانی وەحی :**

ئیبن و قەییم (ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لەبارەی پلە و چۆنیەتی جۆرەکانی وەحی،ئاماژە بە حەفت شێوازی هاتنەخوارەوەی وەحی دەکات،ئەوانیش بریتین لە :

١-خەونی ڕاست :

٢-دابەزینی وەحی بۆ سەردڵی پێغەمبەری خوا :

٣-هاتنی فریشتە لەشێوەی پیاو و قسەکردنی ڕووبەڕوو لەنێوان پێغەمبەری خودا و جبریلەوە.

٤-دابەزینی وەحی چەشنی دەنگی جەڕەسێك :

---

[١] کتێبی ژیانی ئازیزمان ( حبیب محمد سعید ) ( ل ، ١٧٦ )





٥-دابەزینی فریشتە لەشێوەی ڕاستەقینەی خۆی

٦-وەحی ڕاستەوخۆی خودا بۆ پێغەمبەرەکەی : وەک ئەوەی شەوی ئیسرا دا کە نوێژ و هەندێك حوکمی تری پێ فەرموو.

٧-قسەکردنی ڕاستەوخۆی خودا لەگەڵ پێغەمبەرەکەی بەبێ بوونی فریشتە: وەک ئەوەی خودا قسەی لەگەڵ موسا کرد ( علیەالسلام ).ئەمەیان لەقورئان تەنها لەگەڵ موسا ( علیەالسلام) باسکراوە،بەڵام لەفەرموودە هاتووە ، وەک ئەوەی لەشەوی ئیسرا باس کراوە.



## سەرەتای دەست پێکردنی بانگەواز:

دوای ئەوە ، ماوەیەك وەحی لە ئاسمانەوە پچڕا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زۆر غەمبار و دڵتەنگ بوو کە هیچی نەدەبینی و هیچی بۆ نەدەهاتە خوارەوە ، شەیدا وموشتاقی وەحی بوو ، ئەوەبو جوبرەئیل لەسەر کورسیەك لە نێوان ئاسمان و زەوی دا خۆی پیشانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دا . چەسپاوی کرد و دڵی دایەوە و مژدەی پێدا کە ئەو پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم و خودا هەڵی بژاردوە بۆ گەیاندنی پەیامەکەی ، پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم کە ئەوەی بینی ترسا و گەڕایەوە بۆلای خەدیجە . خوای لێ ڕازی بێت . و فەرمووی : دامپۆشن ، بمپێچنەوە ، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاندە خوارەوە:-(يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١)قُمْ فَأَنْذِرْ (٢)وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤))[١].واتە : ئەی ئەو کەسەی خۆی پێچاوەتەوە ، هەستە خەڵکی بێدار کەرەوە ، پەروەردگارت بەگەورە ڕابگرە ، جل وبەرگەکانت پاك بکەوە.

خوای پەروەردگار لەم ئایەتانەدا فەرمانی پێ دەکات کەوا ئوممەتەکەی خۆی بێدار کاتەوە و بیانترسێنی وبانگیان بکات بۆلای ( الله ).ئەویش پشت بەخوا هەستا و قۆڵی لێ هەڵماڵی و هەڵسا بەگەیاندنی بە باشترین شێوە ، بانگی ڕەش و سپی ، پیر و گەنج ، منداڵ و گەورە ، ژن و پیاو ، بەندە و ئازادی کرد.

[١] المدثر





بەڵام ئەم هەوڵ و گەیاندنەی بەئاشکرانەکرد چونکە کاتێك پەیامی ئیسلامیش هات حاڵی مەککە هەر وەك خۆی وا بوو، پڕ بوو لە بت. جا لە حیکمەت و دانایی نەبوو لەگەڵ ئەم حاڵەی کە عەرەبەکانی لەسەر بوون لە خوونەریت و ئایین لە زێد و باپیرانەوە بۆیان مابۆوە و بە پیرۆزیان دەزانی یەکسەر و بێ هیچ بنەمایەک و خۆئامادەکردنێك پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی ئیسلامی ئاشکرا بکات .

بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرەتای بانگەوازی بە تاک ( بانگەوازی نهێنی ) دەست پێکرد و سەرەتا لە نزیکترین کەسی خۆیەوە دەستی پێکرد، پێشەنگی هەمووان خەدیجەی کچی خوەیلد موسڵمان بوو،پاشان عەلی کوڕی ئەبی تاڵب ی ئامۆزای کە تەمەنی (دە ) ساڵ بوو موسڵمان بوو کە بەیەکەم منداڵ دادەنرێت موسڵمان بوویێت[1] ،دوای ئەو زەیدی کوڕی حارثە[2] کە ئەو کات بەندەی پێغەمبەری خوا بوو،دواتر کچەکانی هەر یەک لە زەینەب و ئوم کەلثوم و فاتیمە و ڕوقییە موسڵمان بوون.[3]

دواتر لە هاوڕێکانی ئەوانەی دەیناسین و متمانەی لە سەریان بوو بانگی کردن، ئەوانەی دەیزانی خێرو حەق و چاکەیان خۆش دەوێت و دەیانەوێ شوێنی بکەون.

دوای ئال و بەیت ئەبوبەکر ( ڕەزای خوای لێبێت) پیاوێکی خاوەن ڕەوشتی بەرزو چاکەخوازو خۆشەویست بوو، زوو دەچووە دڵەوەو خۆشیان دەویست، هاتە ناو

---

[1] السيرة النبوية لابي شهبة (٢٨٤/١)

[2] بڕوانە : المرآة في العهد النبوي،.( د. عصمت الدين) (٤٢).

[3] السيرة النبوية لابي شهبة ( ٢٨٤/١)





ئیسلام و دڵ و باوەشی بۆ ئەم پەیامە مەزنە کردەوە کە یەکێ بوو لەهاوڕێکانی پێغەمبەری خودا ﷺ.

ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازیبێت) لەگەڵ موسڵمانبوونی دانەنیشت و چاوەڕوانی نەکرد بەڵکو کەوتە چالاکیەکی بێ وێنە بۆ بانگەوازی پەیامی خودا.

ئەبوبەکر ( ڕەزای خوای لێبێت)ئەو کەسانەی متمانەی پێیان هەبوو بانگی کردن و ئیسلامی پێ ڕاگەیاند،بۆیە بە هۆی ئەم هەوڵ و دڵسۆزییەی ئەبوبەکر ( ڕەزای خوای لێبێت )چەند پیاوێکی گەورە و مەرد هاتنە ناو ئیسلام، لەوانە :(عوسمانی کوڕی عەفان و زوبەیری کوڕی عەوام و عبدالرحمنی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وقاص و طەلحەی کوڕی عبدالله خوا لێیان ڕازیبێت)[1].

هەروەها لەگەڵ موسڵمان بوونی ئەم پیاوە مەزنانە ئەوانیش دەستیان کرد بەبانگەوازی دەورووبەریان ئەوانەی کە جێگەی متمانەیان بوون،بۆیە کۆمەڵێکی تر موسڵمان بوون لەقوڕەییش،جا ئەمانە بوونە سەرەتای یەکەمینی پێشەنگەکان وەک خوای گەورە باسیان دەکات و دەفەرموێت :-( **وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٠٠)**[2]

---

[1] بڕوانە : التربية القيادية (١/١١٦)

[2] التوبة



واتە:- خوای میهرەبان لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا لەکاروانی کۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووەو ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون کە چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا بۆ هەمیشەیش تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرئەنجامە سەر کەوتنێکی زۆر گەورەیە.

دوای ئەوانە کۆمەڵی دووەم هاتنە ناو ئیسلام کەکەسانی ئازاد بوون،وەک ( ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاع-ئەبو سەلەمەی پورزای پێغەمبەری خوا-بەڕڕەی کچی عبد موتەڵیب و برای شیرییەکەی-ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمی مەخزوومی-عوسمانی کوڕی مەزعونی جومەحی-عوبەیدی کوڕی حاریسی کوڕی عبد موتەڵیب-سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل-قودامە و عبداللهی کوڕانی مەزعون-فاتیمەی کچی خەتتاب(خوشکی ئیمامی عومەر ) و سەعیدی کوڕی زەیدی هاوسەری-ئەسمای کچی ئەبوبەکر-خەتتابی کوڕی ئەرەتی هاوپەیمانی بەنی زوهرە[1] .

دوای ئەوانەش کۆمەڵی سێیەم موسڵمان بوون، وەک ( عومەیری کوڕی ئەبی وەقاص-عبدالله ی کوڕی مەسعود-ئیبنو شەمخی کوڕی مەخزوم-مەسعودی کوڕی قاڕی- سوڵەیتی کوڕی عەمر-حاتبی کوڕی عەمر-عەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە و خێزانەکەی-ئەسمای کچی سەلامە-خونەیسی کوڕی حوزافەی سەهمی-

[1] بڕوانە : خاتم النبین لابي زهرة ( ٢٩٨ )





عامیری کوڕی ڕەبیعە-ئەسمای کچی عومەیسی خێزانی حاتبی کوڕی حاریش و فاتیمەی کچی موجەللیلی خێزانی و خەتتابی کوڕی حاریسی برای و فوکەیهەی کچی یەساری خێزانی-مەعمەری کوڕی حاریس و سائیبی کوڕی عوسمانی کوڕی مەزعون-موتەڵیبی ئەزهەر و ڕەملەی کچی عەوفی خێزانی-نەحامی کوڕی عبداللهەی کەڕی ئوسەید-عامیری کوڕی فوهەیرەی مەولای ئەبو بەکر-فوهەیرە و دایکی-خالیدی کوڕی سەعدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییەی کچی خەلەفی خێزانی و ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی عەبدوشەمس-واقیدی کوڕی عەبدوناف-خالێد و عامیر و عاقیل و ئیلیاس بەنولبوکەیری کوڕی عەبدویالیل –عەمماری کوڕی یاسر-صوهەیبی کوڕی سینان کە پێی دەگوترا سابق الروم-ئەبوزەڕی غیفاری و ئونەیسی برای و دایکی-بیلالی حەبەشی.

ئەمانە (السابقون)یان پێ دەگوترێت کە زیاتر لە چل کەس دەبن.[1]

وە دوای ئەمانەش پۆل پۆل خەڵکی دەهاتنە ناو ئیسلام.

---

[1] صەلابی ( وەرگێڕانی : احسان برهان الدین) ( ل. ١٤١)





## فەرزبوونی نوێژ:

نوێژ پەرستشێک بوو کە موسڵمانان لەسەردەمی مەککەدا فەرمانیان پێدرابوو ئەنجامی بدەن،بێجگە لەمە هیچ فەرزێکی دیکە لەئارادانەبوو،ئایەتەکانی تریش کە دادەبەزین زیاتر باسی لە بەتاک دانانی الله دەکرد و سەرنجی لەسەر یەکخواپەرستی و پاک کردنەوەی دەروونی موسڵمانان بوو.

جبریل هاتەلای پێغەمبەری خودا کە لەسەرووی مەککەوە بوو لەلای دۆڵێکەوە،ئیتر کانییەک هەڵقوڵا،جبریل دەستنوێژی گرت،پێغەمبەریش تەماشای دەکرد،دواتر ئەویش دەستنوێژی گرت وەکو جبریل،دوای ئەوە جبریل هەڵسا و نوێژی کرد،پێغەمبەریش بە نوێژەکەی ئەو نوێژی کرد،دوایی جبریل ڕۆیشت و پێغەمبەر گەڕایەوە و دەست نوێژی گرت بۆ ئەوەی خەدیجە فێر بێت و دواتر نوێژی کرد بەهەمان مەبەست.[1]

وە ئیمامی عەلی سێ یەم کەس بوو نوێژی کرد دوای پێغەمبەر و خەدیجە[2]،دواتر کچەکانی و موسڵمانانی تر.

---

[1].( بڕوانە : ابن هشام (٢٤٤/١)،من معين السيرة،صالح الشامي (ل.٤١)—صەلابی ( وەرگێڕانی : احسان برهان الدين)، (ل.١٣٤))

[2].( ابن اهشام ( ٢٨٤/١)،صەلابی (ل.١٣٥) )





## ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم:

لە کاتێکدا ژمارەی موسوڵمانان زیادی کردوو گەیشتە سی کەس ئیدی کۆکردنەوەی موسوڵمانان لەجێیەکدا بەمەبەستی حاڵیکردنو تێگەیاندنیان کارێکی پێویست بوو،پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوای شوێنێکدا دەگەڕا بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی تازە بوونەتە موسڵمان، بتوانن کۆببنەوە و ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن.

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەپلان و شوێن و ماڵی ئەرقەم کردەوە، هەستی کرد زۆر گونجاوە، ئەرقەمیش،کاتێ بە ئەرقەمی ڕاگەیاند،ئەرقەم گوتی "ماڵی من ماڵی تۆیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ"، و ڕەزامەندی نواند لەسەر بەکارهێنانی ماڵەکەی،لەهەمانکاتدا ئەو یەکێک بوو لەو کەسە دەگمەنانەی خوێندەواری هەبوو لەبەر ئەوە ئەرکی نووسینەوەی ئەو ئایەتانەی دادەبەزین خستە ئەستۆی خۆی .

هەر بۆیە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم بۆ ئەومەبەستە دەستنیشانکرا، ئەویش بەهۆی ئەو تایبەتمەندیانەی لەو ماڵەدا دەستەبەربوو وە لەباقی ماڵەکانی تری جیادەکردەوە.





## تایبەتمەندییەکانی ماڵی ئەرقەم[1]:

- ئەم ماڵە لەپاڵ بەرزایی سەفا و نزیک مزگەوتی حەرەمدا بوو، لە هەمان کاتدا ماڵەکە لە کۆڵانێکدا بوو، چەندین دوکانی گەورە و بچوکی تێدا بوو، ئەمەش ئەو ناوچەیەی قەرەباڵغ کردبوو، بەجۆریکیوا کەسیفەتی سەربەخۆییو نهێنی بوونی لەهاتوچۆکردندا پێبەخشیبوو.

-هەروەها دەتوانرا لەو ماڵەوە بە چوار ڕێگادا بچیت بۆ کەعبە و بگەڕێیتەوە،بوونی ئەم ڕێگایانە هەمیشە بژاردە بووە بۆ پاراستنی ئاسایشی مسوڵمانەکان.

-لە هەمان کاتدا لە ئەگەری هەڵکوتانە سەر ماڵەکەدا لەلایەن قورەیشەوە، دەتوانرا ڕێگەی جیاواز بۆ هاتن و دەرچوون بەکاربهێنرایە.

-خانوەکە بواری بۆ قۆستنەوەی جێیەك لەجێیەکانی لەلایەن دوژمنەوە تێدا نەبوو بەمەبەستی بەکارهێنانی بۆکاری چاودێریکردنو ئاگاداربوون لەوەی لەنێو ماڵەکەدا ئەنجامدەدرێت.

-لەبەر ئەوەی خاوەن ماڵەکە خۆی موسوڵمانبوو، بۆیە ئاشکراکردنی نهێنی کارەکە لەلایەن خاوەن ماڵەکەوە بەهیچ شێوەیەك ڕووی نەدەدا.

[1] t.me/islahweb





-خاوەن ماڵ تا ئەوکاتە موسوڵمان بوونی خۆی ئاشکرا نەکردبوو.بۆیە لەنێو خەڵکیدا بەموسوڵمان نەناسرابوو، وەتەمەنیشی کەشازدە ساڵبوو جێگەی سەرنج نەبوو.

ئەم هۆکارانە وای کردبوو کە باشترین شوێن بێت بۆ ئەنجامدانی پەروەردە و فێرکردن،هەڵبژاردنی ئەم ماڵە بەمەبەستی پەروەردە و فێرکردن لەڕووی ستراتیژییەوە لەلایەن پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکی هۆشیارانە بوو.لەبەر ئەوەی لەو شوێنەدا هەستیان پێنەدەکرا و بەبێ ئەوەی کەس بێزاربکەن، وانە و پەروەردەیان تێدا ئەنجام دەدا.

## کۆمەڵە بانگخوازەکان لەکاتی نهێنیدا:

لەسەرەتای دەستپێکردنی بانگەوازدا دروستکردنی چەند گروپێکی بچووك کەژمارەی تاکەکانی لەپێنج کەس تێنەپەڕێت شتێکی پێویست بوو، ئەویش لەپێناو فێرکردنی کاروفرمانی دینەکەیانو، ڕوونکردنەوەی ئامانجی بانگەوازەکەیان... دیارە ئەم کارەش چەند لایەنێکی باشی خۆی هەیە، لەوانە:

١- ئاسانی یەکتر بینینو کۆبونەوە.

٢- ئاسانی دابینکردنی بنکە یان بارەگا.





٣- ژمارەیەکی لەو جۆرە جێگەی سەرنج نییەو گومان دروست ناکات ئەگەر لە ماڵێکیشدا پێکەوە کۆببنەوە.

بێگومان ڕێکخستنی کاری هاتوچۆ لەوهۆکارە گرنگانەیە کەدەبێتە یارمەتیدەر بۆ پاراستنی نهێنی شوێنەکە، وەهەروەها کەمی ژمارەی کۆبونەوەکان، وە ئەنجامدانییان لەشوێنە جیاوازەکانو لەگەڵ بوونی ماوەو زەمەن لەنێوانیاندا زامنی بەردەوامبوونی کارو، هۆکاری پەرتکردنو بەفیرۆدانی هەوڵەکانی بەدواداچوونی دوژمنانە،ئەم کۆبونەوە بچوکانە دەشێ بەناوکەپێکهێنەرەکانی کارگەیەکی بچوککراوە دابنرێت بۆ ڕاهێنانو پاکژکردنی دەروونەکانو سازاندنیان لەپێناو خۆڕاگریو هەڵگرتنی کۆڵی قورسی بانگەوازەکە، ئەویش لەڕێی:

-فێرکردن و تێگەیاندنی ئەندامان لەژیانی هاوەڵان (خوا لێیان رازی بێت) بۆ تێگەیشتن لەکارو فرمانی دینەکەیان بەتایبەت لەقورئانی پیرۆز.

-ئەنجامدانی نوێژەکان بەکۆمەڵ (جەماعە) ت[١].

---

[١] یەکێ لە هۆکارەکان ئەوەبوو دانانی ماڵی ئەرقەم وەکو شوێنی سەرکردایەتی دوای ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیە کە سەعد تیایدا دەرکەوت،ئیبنو ئیسحاق دەڵێت : هاوەڵان کاتێک نوێژیان بکردایە دەچوونە ڕێگوزاری شاخەکان لەمەککە،جارێکیان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵان نوێژیان دەکرد لەو شاخە،لەوکاتەدا چەند کەسێك لەموشریکان ئەوانیان بینی،ئیتر نکۆڵییان لێکرد و کارەکەیان بەشتێکی خراپ زانی ،جا لەو ڕۆژەدا سەعد بەپارچە ئێسقانی حوشترێک لە یەکێ لەو بتپەرستانەی دا و بریندارى کرد،ئەوە یەکەم خوێن بوو لەپێناو خودای گەورە ڕژێنرا. ئیبن اهیشام ( ١/٢٣٦)



-دەستەبەرکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتیو نەهێشتنی جیاوازی لەنێو موسوڵمانانندا.

## کردنەوەی یەکەم خوێندنگای ئیسلام :

ماڵی ئەرقەم یەکەم خوێندنگا بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە کردییەوە،خوێندکارەکانیش لەم خوێندنگایە دەست بەکاربوون،پێغەمبەری خوا لەگەڵ خوێندکارەکانیدا ئەوکاتانەی دیاریان کردبوو، کۆدەبوونەوە و پەیامی نوێی پێدەگەیاندن،ئەو ئایەتانەی وەک وەحی دادەبەزینە خوارەوە لەلایەن خوای گەورەوە، سەرەتا بەئەوانی دەگەیاند و وانەیان لەسەر دەخوێند .

لێرەدا بۆ ئەوەی موشریکەکان بەم خوێندنگا و پەروەردەیە نەزانن، زۆر بە ئاگاییەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد. لەبەرئەوە تەنها هەندێك لەوکەسانەی موسڵمان ببوون، دەیانتوانی سەردانی ئێرە بکەن و پەروەردە بکرێن لەسەر رێگای ئیسلام. ئەم هۆکارانە وای کردبوو کە ئەم شوێنە پیرۆزە، بۆ هەموو کەسێک کراوە نەبێت. بەڵام بۆ ئەوەی زانیارییەکان بە هەموو لایەکدا بڵاو ببێتەوە و پەیوەندی ئەو کەسانەی تازە موسڵمان دەبن بەهێزتر ببێت، پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی لەنێوان هاوەڵانیدا دروست کردبوو.

---

وە پاشان ماڵی ئەرقەم بانگدەکرا بە ماڵی ئیسلام ( دارالاسلام).





ئەو کەسانەی لەم خوێندنگەیەوە فێردەکران، بەهۆی ئەو پەیوەندییە برایەتییەی لەنێوانیاندا دروست ببو، زانیارییەکان بڵاوەی پێدەکرا بۆ هاوەڵانی دیکەش،ئەم سیستەمە وایکردبوو پەیوەندی بەردەوام هەبێت و پەروەردە و فێرکردنیش بەردەوام بێت،لەم سیستەمی برایەتییەدا لەپاڵ بەرزراگرتنی مەعنەویەت، لەلایەکی دیکەشەوە ورە و هاندان دەستەبەردەکرا،هەروەها لەو ڕێگەیەوە هاوکاری ماددی ئەو خێزانانەش دەکرا کە موسڵمان ببوون .

ئەوکەسانەی موسڵمان بوون، بەپێی دیاریکراو بەرپرسیارێتی و ئەرکی پێدەدرا،ئەم کارانە ئەوەندە بەشێوەیەکی ڕێک و بەنهێنی ئەنجام دەدران، موشریکەکانی مەککە بەهیچ شێوەیەک هەستیان بەوکارە نەدەکرد.

ماڵی ئەرقەم بۆ موسڵمانەکان دیاری کرابوو بەشێوەیەکی ئاشکرا،بەڵام چەندین ماڵی دیکەش دواتر هاوشێوەی ماڵی ئەرقەم کارەکانی تێدا ئەنجام دەدرا.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ستراتیژییەی دووبارە دەکردەوە کە بۆ موسا (علیه السلام) دابەزیبوو لە قورئاندا،وەک لەسورەتی یونس ئایەتی (٨٧) هاتووە دەڵێت: ( وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّآ لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ ۗ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ )،واتە:- ئێمە وەحیمان نارد بۆ موسا (علیه السلام) و براکەی تا لە میسردا چەند ژوورێک ئامادە بکەن و ئەو ژوورانەش بکەنە شوێنی خواپەرستی و ڕووی تێبکەن و پێمان گوتن نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن، مژدەش بدە بە ئیمانداران.





پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیلهام وەرگرتن لەم ئایەتەوە، چەندین ماڵی موسڵمانانی کردبوویە مزگەوت و خوێندنگا.

ئەوکەسانەی تازە دەبوون بەموسڵمان، لە پاڵ ئەوەی چاوەڕوانی وەحییان دەکرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لە هەمان کاتدا بە تامەزرۆییەوە ئەو ئایەتانەیان دەخوێندەوە کە دابەزیبوون و لەنێوان خۆیاندا وانەیان لەسەر دەخوێند. لە پاڵ ئەمانەشدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە مژدەی داهاتووی دەدا بە موسڵمانان و ڕاستەوخۆ ئاگاداری هەموو کارەکانیان بوو.

## ئەووانانەی دەخوێنران :

پێغەمبەر(د.خ) کاتێك وانەیەکی فێری هاوەڵان دەکرد و لە ماڵی ئەرقەم کۆی دەکردنەوە، چەند وانەیەکی گرنگی فێر دەکردن، گرنگترینیان ئەمانە بوون

-**باوەڕبوون بە خوای گەورە و پشت بەستن بە خوا:** موسڵمانان فێردەکران باوەڕ بەیەکایەتی خوا بهێنن و هاوەڵ بڕیار نەدەن،وە لەهەموو بارودۆخێکدا پشت بە خوا ببەستن.

-**خۆشەویستی موسڵمانان بۆ خوا و پێغەمبەر():**فێردەکران خوا و پێغەمبەری خوایان خۆش بوێ و گوێڕایەڵ بن.





**-سوود و زیان،تەنها بەدەستی خودایە:** فێردەبوون هەموو شتەکان لەدەستی خودایە بەزیان و سوودەکانەوە

**-خۆڕاگری:** دەبێت موسڵمان لەبەردەم سەختی و ناخۆشیەکانی ژیاندا خۆڕاگر بێت، ماندوو نەبێت و واز نەهێنێت.

**-دڵسۆزی:** پێغەمبەر(د.خ) لەوانەکانیدا هاوەڵانی فێری ئەوە دەکرد کە دڵسۆز بن و کەمتەرخەمی نەنوێنن، هەرچی کارێکیان پێ دەکرێت بیکەن.

**-کاری چاکە کردن:** دەبێت موسڵمان هەمیشە کاری چاکە بکات و نەچێت بە لای خراپەدا، چونکە چاکەکردن لای خوا خۆشەویستمان دەکات و پاداشتی ڕۆژی دوایی هەیە کە بەهەشتە.

**-دوعاکردن و پاڕانەوە لە خوای گەورە و میهرەبان:**موسڵمان دەبێت هەر شتێکی ویست داوا لە خوای گەورە بکات تاکو پێی ببەخشێت.

**-خوێندنەوە و خوێندەواری:** پێغەمبەر(د.خ) موسڵمانانی فێر دەکرد هەمیشە سەرقاڵی خوێندن و زانست بن، چونکە وڵات و جیهانی ئیسلامی تەنها بە زانست پێش دەکەوێت.

**-ڕاستگۆیی و قسەجوانی:** پێغەمبەر(د.خ) فێری دەکردن کە هەرگیز نابێت موسڵمان درۆ بکات، بەڵکو دەبێت ڕاستگۆ بێت، چونکە خوای گەورە هەرگیز حەز ناکات درۆزن ببینێت.



**-پشتگیری حەق و ڕاستی:** پێغەمبەر(د.خ) موسڵمانانی فێر دەکرد کە هەمیشە پشتگیری حەق و ڕاستی بکەن، تەنانەت ئەگەر برا و خوشکیان خراپ بوون، نابێت پشتگیریان بکەن.

## چۆن سەرکەوتوو بوون لەم بانگەوازی نهێنییەدا ؟ :

بۆ سەرکەوتنی هەر کارێکی نهێنی پێویستە چەند خاڵێکی سەرەکی جێبەجێ بکرێت :

**یەکەم : پاراستنی نهێنی :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **(استعينوا على إنجْاحِ الحوائِجِ بالكتمانِ ؛ فإنَّ كلَّ ذي نعمةٍ محسودٌ)**[1]،واتە: بۆ سەرگرتنی کارەکانتان ڕێگەی پەنهانکاری بگرنەبەر، چونکە هەموو خاوەن نیعمەتێك ئیرەیی پێبەری هەیە.

ئەگەر نهێنی پارێزی بۆ کاروباری تاک پێویست بێت، بێگومان بۆ کاروباری گشتیو پەیوەست بەدوارۆژ و سەرەنجامی ئوممەتێك پێویستییەکەی زیاترو لەپێشترە.

---

[1] الراوي : معاذ بن جبل وعمر بن الخطاب وابن عباس وعلي بن أبي طالب | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الجامع /الصفحة أو الرقم | ٩٤٣ : خلاصة حكم المحدث : صحيح





بێگومان هاوەڵانیش ( ڕەزای خوایان لێبێت) زۆر وورد بوون لەپاراستنی ئەم نهێنییە و بەهیچ شێوەیەک نەیاندەدرکاند

**دووەم : خۆ بێ بەری کردن و نکۆڵی کردن :** هاوەڵان کاتێ پرسیاریان دەربارەی ئەبوبەکر و پێغەمبەر لێکرابا نکۆڵییان دەکرد لێیان و خۆیان بێبەری دەکرد.

کاتێ ئەبوبەکر دەیویست زانیاری دەربارەی پێغەمبەری خوا بزانێت داوای لە دایکی کرد ( هێشتا موسڵمان نەببوو)بچێتە لای دایکی جەمیل ( بەنهێنی موسڵمان ببوو)تا پرسیاری پێغەمبەری خوا بکات

کاتێك چوو بۆ لای دایکی جەمیل و پرسیاری کرد لەبارەی شوێنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نکوڵی کرد لەوەی کە ئەبوبەکرو موحەمەدی کوڕی عبدالله بناسێت.

دایکی جەمیل ویستی خۆی هەستێت بەکاری گەیاندنی زانیاریەکە بەئەبوبەکر، بۆیە گوتی: گەر پێتخۆشە لەگەڵت بێم بۆلای کوڕەکەت ئەوە باشە، ئیدی دایکی ئەبوبەکریش بەبەڵێ وەڵامی دایەوە.

کاتێك ئەبوبەکر پرسیاری لەبارەی حاڵی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) لێکرد دایکی جەمیل لەدایکی ئەبوبەکر دوو دڵ بوو گوتی: ئەوە دایکتە گوێی لێیە؟ ئەبوبەکر پێی گوت: بێخەمبە لێی، ئیدی ئەوکات هەواڵەکەی دایە کەپێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سەلامەتەو حاڵی باشە، وەبۆ زیاتر قایمکاریو پارێزکاری





نهێنی پارێزی هەواڵی پێنەدا لەکوێیە تا ئەبوبەکر پرسیاری لێکرد: ئەو لەکوێیە؟ گوتی: لەماڵی ئەرقەمە.

**سێیەم : لەسەرەخۆیی و پاراستنی هێمنی و خێراییو دروستی هەڵسوکەوتەکان لەساتە چاوەڕوان نەکراوەکاندا :**

کاتێك عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) بۆماڵی سەعیدی ئامۆزای دەڕۆیشت، ئەو کات خەبابی کوڕی ئەرەتو فاتیمەی کچی خەتتاب خێزانی سەعید لەژوورەوەبوون، کەگوێیان لەدەنگی عومەربوو خەبباب لەجێیەك وەك حەشارگە لەژورەکەدا خۆی شاردەوە، فاتیمەش خێرا پارچەنوسراوەکەی هەڵگرتوو خستیە ژێر ڕانەکانی، بەڵام کاتێك کەعومەر نزیك بویەوە گوێی لە دەنگی خەباب بوو کەقورئانی بۆ دەخوێندنەوە، بۆیە کاتێك هاتەژوورەوە گوتی: ئەو ژاوە ژاوەتان چی بوو؟ گوتیان تەنها قسەی ئاسای نێوان خۆمان بوو.

بێ ئەوەی بشڵەژێن و گومان لەسەر خۆیان دروست بکەن،تا کۆتایی بەهێمنی و جێگیری مانەوە و عومەر موسڵمان بوو.

**چوارەم: جێ نەهێشتنی شوێنەوار:** وەک نمونەی فاتیمەی خوشکی ئیمام عومەر کاتێک پەڕاوەکەی شاردەوە و خەبابیش خۆی حاشاردا ....تاکۆتایی باسەکە.(دواتر عومەر(ڕەزای خوای لێبێت) موسڵمان بوو)

**پێنجەم : نزمکردنەوەی دەنگ لەکاتی کۆبونەوەدا :** وە چەندینی تر کە موسڵمانان لەکاتی بانگەوازی نهێنیدا بەکردار ئەنجامیان دەدا.





## بۆچی پێغەمبەری خوا ئەم شێوازەی پەیڕەوکرد تەنانەت دوای ئاشکراکردنی بانگەوازیش ؟ :

چونکە موشریکەکان نەیاندەتوانی واز لەو عادەت و تەقالیدە ئاینییەی خۆیان بهێنن کە چەندین ساڵە پەیڕەویان دەکرد،وە تایبەت نەیاندەتوانی واز لە بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانی خۆیان بهێنن.

موشریکەکانی مەککە،وەک ئەوەی باوەڕیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەهێنا، ڕێگرییان لە کەسانی دیکەش دەکرد ببنە موسڵمان. ئەم ئایینە نوێیەیان بە بیدعە ناویان دەبرد و دەترسان لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەخەڵکی بگات و بەهێز ببێت،لەبەر ئەوە باوەڕیان نەدەهێنا و ئەوانەشی موسڵمان دەبوون، دەیانخستە ژێر چاودێرییەوە، تەنانەت ئەوانی بێهێزبوون و هیچ پاسەوانێکیان نەبوو، ئەشکەنجە و ئازاریان دەدان،بەشێوەیەک نەیاندەتوانی هیچ کاری تەبلیغ و گەیاندنی ئیسلام لەگەڵ ئەو کەسانە بکەن

پێغەمبەری خوا ﷺ یش ڕێگەیەکی دەگرتە بەر بۆئەوەی ناڕەزایەتی و فشارەکانی ئەوان کەمتر بکاتەوە، بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی زیاتر بارودۆخی مەککە ئاڵۆز نەبێت، کارێکی لەو شێوەی ئەنجام دا،هەستی دوژمنایەتی موشریکەکانی کەم کردبوویەوە و ئەو کەسانەشی کۆنترۆڵ کردبوو کە هەوڵی دوژمنایەتییان دەدا،هەروەها ئەم کارە ببووە هۆی پاراستنی ماڵ و گیانی ئەو کەسانەی تازە دەبوونە موسڵمان.



پێغەمبەری خوا ﷺ شەش ساڵی تەواو بەو شێوەیە تەبلیغی ئەنجامدا و شێوازی ئارامگری چالاکانەی پیشاندناین،ئەوانەی لە دەرەوە تەماشایان دەکرد، وایان دەزانی هیچ کارێک ئەنجام نادات،کەچی لەژێرەوە چەندین چالاکی دەکران.

ئەمانەش سەلمێنەری ئەوڕاستییەن کە قۆناغی مەککە قۆناغی دانیشتن و هەست کردن بەبێ کەسی و سک بەخۆ سوتان نەبوو لەبەر ژمارەی کەمی موسڵمانان و لەبەر زوڵم و ستەمی بێباوەڕان،بەڵکو قۆناغی مەککە پڕ چالاکترین قۆناغ بوو لەڕووی فێربوونی زانست و ئامادەکردنی سەرکردە و بانگەوازی و بەهێزکردنی برایەتی و ...تاد.

## سەرنج لەسەرماڵەکەی ئەرقەم:

-نابێت بگوترێت لە ماڵێکدا چ کارێک ئەنجام دەدرێت.

-دەکرێت لە کاتی ئاسایی و لەکاتی ناڕەحەتیدا ماڵەکان بکرێت بە مزگەوت و دەرگایەک بێت بۆ ڕزگاربوون.

-ماڵی ئەرقەم، نموونەیەکی زیندووە کە بە چ شێوەیەک بەکاربهێنریت لەو بارودۆخانەدا.

-ماڵی ئەرقەم پرۆژەی کارکردنە لە هەموو شوێنێک نەک تەنها لەشوێنێک.

-هۆکارێکە بۆ پێگەیاندنی کەسانێک کە ڕووناکی بۆ کۆمەڵگا بگەڕێننەوە.





-نموونەیە  بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام بەشێوەیەکی پلانسازی.

-نموونەیەکی سەرکەوتووە بۆ ئەنجامدانی چەندین کار بەبێ ئەوەی قین و نەفرەت و حەسەد لە دڵی دوژمندا زیاد ببێت و گەشەبکات.

## خواپەرستی لەسەردەمی مەککەدا :[1]

پێغەمبەری خوا لەم ماوەیەی بە نهێنی کاری دەکرد بەچەندین شێواز کاری لەسەر باوەڕداران دەکرد تا پتەو و جێگیرییان بکات لەسەر باوەڕەکەیان،وە لەداهاتووشدا هەر کەسێک لەمانە ببنە پێشەواو و سەرکردە و پیاوی تەنگانە .

**یەکەم کار کە ئەنجامیدا خاوێن کردنەوەی باوەڕداران بوو بەچەندشێوازێکی خواپەرستی:**

پێغەمبەری خوا هاوەڵانی پەروەردەکرد لەسەر پاک کردنەوەو پاک ڕاگرتنی دڵەکانیان لەڕێگەی سوڕەتەکانی قورئانەوە.

پاککردنەوەی دڵ بەقورئان و یادی خودا گرینگترین کارە مرۆڤ بیکات،چونکە گەر دڵ غەش و پیسی تێدابوو هیچ ڕێزێک بەرامبەر خودانانوێنێت و تاوانکردنی گەورە و بچووک ئەگەرێکی کراوە دەبن و ئاسایی دەبن بۆ ئەنجام دانیان.

---

[1] سیرەی صەلابی بەدەستکاری و کورت و پوختکراوی





**ئەو خوا پەرستییانەی کە دڵ و گیان پاراودەکەن دوو جۆرە :**

١-ئەنجامدانی کردارەکان : ئەو کردارانەی فەرزکراون،وەک (دەستنوێژ و نوێژ و زەکات و حەج و ...تاد)

٢-ئەنجامدانی گشتی : ئەنجامدانی ئەو کارانەی بەگشتی مرۆڤ لەخوا نزیک دەکەنەوە و ئەنجامدەری پاداشت دەدرێتەوە و دڵ و گیانی پەروەردە دەکات.[١]

نوێژ لەپێش هەموو عیبادەتانەوە دێت کە دڵی مرۆڤ پاک دەکاتەوە و کاریگەری زۆری هەیە،هەندێك لەو کاریگەرییانەش :

-دەربڕینی بەندایەتی و گوێڕایەڵیکردنی خودا.

-گفتوگۆکردن لەگەڵ خودا.

-ئاسوودەیی دان بەدڵ.

- پەرژینێکە لەپێش تاوان.

**دووەم کاری پەروەردەکردنی بیروهۆش بوو :** پەروەردەکردنی پێغەمبەری خوا بۆ هاوەڵانی گشتگیر بوو،چونکە لە سەرچاوەیەکی سازگارەوە ئەم پەروەردەیەی وەردەگرت کە قورئان بوو،قورئانیش ئاڕاستەکراوە بۆ عەقڵ ئینجا لەش.

---

[١] فقه الدعوة، د.علي عبدالحليم محمود ( ٤٧١،٤٧٢/١)





گرنگترین ئەو خاڵانەی کە پێغەمبەری خودا لەسەری دەڕۆیشت بۆ پەروەردەی هاوەڵان بریتی بوولە:

١-پاککردنەوەی ئەقڵ لەوشتە نەگۆڕانەی کە لەسەر گومان یان لاسایی کردنەوە بنیاد نراون.

٢-عەقڵ نابێ چەق بەستووبێت بەڵکو دەبێت ووردبوونەوەی هەبێت و تێڕوانین و بیرکردنەوەی هەبێت لەگەردووندا.

٣-ڕامان و جێبەجێ کردنی حوکمەکانی قورئان و فەرموودە.

٤-پەند وەرگرتن لە میللەتانی پێش خۆیان.

**سێ یەم کاری پەروەردەی لەش بوو :**

پێغەمبەری خوا سوور بوو لەسەر پەروەردەکردنی هاوەڵانی لەڕووی جەستەییەوە،تا هاوەڵان لەڕووی جەستەییەوە ئامادەی هەموو جۆرە پێش هات و ڕووداێک ببنەوە.

جا ڕێکخستنەکانیش بەم شێوەیە لەقورئان ئاماژەی پێکراوە : (لەڕووی پێداویستی خواردن و خواردنەوە-پۆشاک - ماڵ - هاوسەرگیری و پاک داوێنی-دارایی و پێویستییەکانی-ڕێکخستنی براگەورە بەقەدەغەکردنی ستەم و زوڵم-کارکردن و زیان نەگەیاندن-خاکی بوون لە هەژاری و دەوڵەمەندی و ساتە جیاوازەکانی ژیان-و چەندینی تر).



ئەمانە بەشێک بوون لەو بنەمایانەی کە پێغەمبەری خوا کاری لەسەر دەکردن لەڕووی لەشەوە تا توانای هەڵگرتنی باری جیهاد و خەمی بانگەواز و گرانییەکانی ژیانیان هەبێت.

**چوارەم : پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر ڕەوشتی جوان :** پێغەمبەری خوا دەفەرموێت :( ما شيءٌ أثقلَ في ميزانِ المؤمنِ يومَ القيامةِ مِن خُلُقٍ حسنٍ ، وإنَّ اللهَ يبغضُ الفاحشَ البذيءَ. )[1]

واتە:- شتێك نییە لەتەرازووی ئیماندار قورس تر بێت لەڕۆژی دواییدا ئەوەندەی ڕەوشت جوانی.

ڕەوشتی جوان بەشێکی گرنگە لە بیروباوەڕ،چونکە بیروباوەڕ ڕاست نابێت بەبێ ڕەوشت،بۆیە پێغەمبەری خوا هاوەڵانی لەسەر ڕەوشتی جوان پەروەردە دەکرد.

ڕەوشت لە پەروەردەکردنی پێغەمبەر کارێکی گشتگیرە،بۆنمونە : ڕەوشتی نوێژ ملکەچ کردنە،ڕەوشتی قسەکردن خۆ دوورگرتنە لەقسەی پڕ و پووچ،ئارەزوبازی ڕەوشتی دوور کەوتنەوەیە لە قەدەغەکراوەکانی خوا،ڕەوشتی مامەڵەکردنیش لەگەڵ خەڵکی میانڕەوییە لەنێوان دەستگرتنەوە و زیادەڕەوی،...تاد[2]

وە یەکخواپەرستی لەسەرڕووی ڕەوشتەوەیە.

[1] الترمذي (٢٠٠٢)حسن صحيح

[2] صەلابی ( وەرگێڕانی : احسان برهان الدين )





هەروەها پێغەمبەری خوا لەڕێی سەرگوشتەکانی قورئانەوە هاوەڵانی ڕادەهێنا لەسەر چەندین بنەمای جوانی دەروونی و جەستەیی و عەقڵی ، بەشێک لەو بنەمایانەش بریتین لە:

-داوێنپاکی بەرامبەر ئارەزووەکان

-ئارامگرتن لەکاتی توڕەبووندا

-نەرمی لەجێگای خۆی

-پشت بەخۆبەستن لەڕێگەی پشت بەخوابەستن

-بیرتیژی بۆ ڕووداوەکانی سالانی پێشوو،بۆ کۆنترۆڵ کردنی سیاسەت و لەبەرچاو ڕوونی کارەکانی خەڵکی

-چاکی نیگا کێشان و بیرەوەری بەهێز،تا شتەکان وەکو خۆی باس بکات

-ئامادەباشی بۆ زانست،لەگەڵ خۆشەویستی و بەهێزبوون تیایدا

-بەزەیی هاتنەوە بەهەژاراندا و خۆ بەکەم زانین

-لێخۆش بوون لەکاتی دەسەلاتدا

چەندینی تر ...



پاش ئەو ئامادەکارییە گەورەی کە پێغەمبەری خوا ئەنجامیدا بۆ پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر بنەمای بیروباوەڕ و خواپەرستی و ڕەوشتی بەرز ،ئیتر ئایەتی (وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ۝ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ)[١]

دابەزی و بانگەواز ئاشکراکرا و هاوەڵان هاتنە دەرو، دەنگی تەوحید ئاسمانی مەککەی تەنی،بەشێوەیەک بێباوەڕان چۆکیان لەگەڵ کەوتە لەرزە و سەرسامی دایگرتن.

## چەند سەرنجێک بۆ ئەم قۆناغە :

-بانگەوازی ئیسلامی لەسەرەتاکانیدا وا پێویستی دەکرد بەنهێنی بێت، تا کارەکانی جێگیر دەبن و بناغە و بنمیچەکەی پتەو دەبێت.

-لەپاشاندا بەتەواوی و پتەوییەوە بانگەشەی خۆی بکات و پەیامی خۆی بگەیەنێت بە گشت جیهان،ئەو پەیامەی کەمەبەستی دەرهێنانی خەڵکییە لەگومڕایی و تاریکی و لەسەرەڕۆییەوە بۆ هیدایەت و ڕێنموونی و خواناسی. تاکو ببێتە سەربەرزی و سەرکەوتن بۆ موسڵمانان و ڕەحمەت و بەزەییش بۆ گشت جیهان.

-ئەم کارە پێویستی بە ئارامی و خۆڕاگری و عەزیمەتێك دەکرد کە هیچ شتێك لە داهاتوودا نەیلەرزێنێت و لەبنی نەهێنێت. جا لێرەوە دەبینین لە حیکمەت و دانایی

---

[١] [سورة الشعراء ٢١٤ - ٢١٥]





بووە کە لە سەرەتادا بانگەواز بە نهێنی بێت، تاکو بۆ خەڵکی مەککە نەبێتە کارێکی کوتوپڕو کاردانەوەی توندوتیژ وەرگرن و دەمارگیری نەفامی بیانگرێت و هەڵسن بۆ بەرگری لە خواکانیان و بتەکانیان .

ئەم هۆکارانە وایکرد ئیسلام جێگیربێت و بەرنامەکە بەسەرکەوتوویی بڵاو ببێتەوە لەهەموو جیهان،ئەگەر چی لەئێستا و جارانیش کۆسپ و تەگەری زۆری خرا بەردەم بەڵام لەسەرەتاوە نەکەوت و تا کۆتایی دونیاش ناکەوێت و پیاوان و ئافرەتانێکی مەرد چۆن لەسەرەتادا بەرگریان کرد و ئیسلامیان خستەسەر شانیان لەئێستا و بۆ داهاتووش پیاوان و ئافرەتانێکی مەرد هەڵدەستن بەئەنجامدانی ئەمکارە مەزنە ئەگەر بەدانانی گیانیشیان بێ.



## کۆتایی :

موسڵمانانی ئەم سەردەمە تایبەت ئەوبەشەی کە سەردەمی ئێستا بە قۆناغی مەککە دەزانن و لێی پاڵ کەوتوون،یان خەریکی مناقەشە و شتی لاوەکین، یان بێ بەرنامە و بێ زانست دەژی،تەنها ئیش و کارەکانی ئەو سێ ساڵە بزانن بەسە تا قۆڵیان لێ هەڵبماڵن و دەست بە چالاکی و بانگەوازبکەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ (سێ) ساڵی تەواو بەو شێوەیە تەبلیغی ئەنجامدا و شێوازی ئارامگری چالاکانەی پیشاندااین،ئەوانەی لە دەرەوە تەماشایان دەکرد، وایان دەزانی هیچ کارێک ئەنجام نادات،کەچی لەژێرەوە چەندین چالاکی دەکران.

ئەمانەش سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن کە قۆناغی مەککە قۆناغی دانیشتن و هەست کردن بەبێ کەسی و سک بەخۆ سوتان نەبوو لەبەر ژمارەی کەمی موسڵمانان و لەبەر زوڵم و ستەمی بێباوەڕان،بەڵکو قۆناغی مەککە پڕ چالاکترین قۆناغ بوو لەڕووی فێربوونی زانست و دامەزراوی بیروباوەڕ و ئامادەکردن و دروستکردنی سەرکردە و کەسانی خاوەن هەڵوێست و بانگەوازکار و بەهێزکردنی برایەتی و ...تاد.

داواکارم لە اللهتعالی لەدینەکەی شارەزامان بکات تا لەسەر ڕاستە شەقامی ئیسلام لانەدەین ....آمین





